# ١



# دەستی پەروەردگارا

حبيب محمد سعيد



١٤٠٤هـ ـ ١٩٨٤

# پێشەکی

**الحمد لله رب العالمين • الصلاة والسلام على رسوله الأمين ، وعلى اله وأصحابه أجمعين ••**

چەند ئاینێکی بێ لەکەیە ئەم ئاینە خوایيە •• هەموو فەرمانێك و قەدەغەیەکی لە جێی خۆیایە ••

سەیر ئەکەین هەموو کارێکی چاکە و پڕسوود لە ئیسلاما بەرچاو گیراوە و فەرمان دراوە بە سەر موسڵمانەکانا بە پێی توانا هەوڵیان بۆ بدەن ••

لە هەمان کاتا هەموو خراپە و تاوانێك یاساخ و قەدەغەیە ••

دیارە تەنها ئیسلام ئەم راستیەی بە رێك و پێکیی

و بێ پێچ و پەنا بەرچاو گرتووە ، چونکە نەخشەی پەروەردگارە و خوا خۆی راستە و راستیی ئەوێ .. وە بوونەوەری لە سەر راستیی دروست کردووە و پەیامەکانیشی کە ناردوونی بۆ پێغەمبەران بۆ گەیاندنی راستیی ناردوونی .. وە هەرچیش وا نەبێ خوا پشتگیریی ناکات

بۆیە هەمیشە دەستی خوا ـ جل جلالە ـ وا لە کارا بۆ ریسوا و سەرشۆڕکردن و لە ناوبردنی ستەمکاران و پیاوخراپان ئەمەش بۆ رزگار کردنی ئادمیەکان ..

(... وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ ...) البقرة/٢٥١

جا دیارە ئەوانەی نەخشەی خوا ئەگرنە بەر ، یارمەتیی و کۆمەکیی ئەویان بۆ دێت ، درەنگ بێ یا زوو بە پێی ویستی پەروەردگار و بە بڕیارێکی پڕ دانایەتیی !.

لەولاشەوە ئەوانەی دژی رێبازی خوا و نەخشە و

بڕیارەکانی ئەوەستن و ستەم و ناڕەوایی بڕەو پێ ئەدەن و زیـان لـە خەڵکیی تـاڵ ئەکەن ـ دیارە لە بـەر نەخۆشیی و ڕەش‌بوونەوەی دڵیـان ـ خوا دەستیان لێ ئـەوەشێنێ ، درەنگ بێ یـا زوو ، دیسان بە دانایەتیی !

وا منیش ـ بە پشتیوانیی خوا ـ ئەم چەند چیرۆکـــە ڕوودراوە ئەخەمە بـەر دەستی خوشك و برا موسڵمانەکانم تا بە ڕاستیی دەستی پەروەردگار ببینن و هەست بکەن خوا هەمیشە وا لـە پشتی سەری بێتاوانانەوە و دەستی یارمەتیان بۆ درێژ ئەکا و هـەرچیش یاخی و سەرکـەش و لاڕێ و ستەمکار بێت سەرشۆڕیی و ئابڕووچوون بەشیەتی ..

ئەمە یاسایەکی هەمیشەییە و پێویستە موســـڵمانەکان ساتێ لـە یادی خۆیانی نەبەنەوە ، وە ئەگەر بێت و سەرنجی قورئـانیش بگرن ئەم ڕاستیە بە هەمە جۆر و چەشن و شێوە ئەسەلمێنێ تا موسڵمانەکان متمانە بە خۆیان و بە ڕێبازەکەیان بکەن و چاك بزان سەربەرزیی و سەرفرازیی هەردووجیهان

بەشی خۆیانە و سەرشۆڕیی و خەجاڵەتیی و ریسوایش بەشی دوژمنانیانە ..

هیواداریین خوا کۆمەکمان بێت تا هەمیشە چاکویست بین و پشتگیریی ستەمی ستەمکاران نەکەین و هەموو کارێکی ئەم ژیانەمان لە بەر رەزامەندیی ئەو بێ و بەس ، تا بەڵکو سەربەرزی رۆژی قیامەت بین ، ئامین ..

هەینیی ٣ی ذولقەعیدەی ١٤٠٣

١٢ی ئابی ١٩٨٣

# خەندەی سەر لێو

پیاوێکی دەست کورت بوو ‎٠٠‎ بەڵام چونکـە خواناس بوو و بە بەشی خـوا رازیی بـوو ، بەختیـاریی تـەواوی دەست کـەوتبوو ‎٠‎ وە لـەگەڵ ئـەوەدا کـە هەژار بوو ، خێزانێکی گەورەی کەوتبوو بە سەرا ، کە بریتیی بوو لـە ژنەکەی و پێنج منداڵ و دوو خوشـك و دایکێکی پیری بـە ساڵا چوو ‎٠٠‎ جا بۆ بە خێوکردنی ئـەم خێزانە دووکانێکی بچکۆلەی سەوزە فرۆشتنی هەبوو کە کەوتبووە سـەر شەقامێکی بچکۆلە بۆ جێ بەجێ کـردنی پێویستیی دەر و دراوسێ هـەژارەکانی ‎٠٠‎ ئـەوەندە کـەم دەسـەڵات بـوو

---

(٭) چیرۆکێکە لە چیرۆکەکانی پەڕاوی « عدالة السماء » ، بە دەستکارییەوە وەرگێراوە ‎٠٠‎

نەی ئەتوانیی لە شوێنێکی چاکدا دووکان بە کرێ بگرێ وەیا کەل و پەلێکی مایەدار بسێنێ ..

بەڵام خانووە شڕۆڵەکەی هەر بە ناو خانوو بوو ، ئەگینا کەلاوەیەك بوو کە بریتیی بوو لە تاقە ژوورێکی بێ کەڵك و دەور و بەریشی پڕ بوو لە کۆمای شڕە و مڕە .

ئەم تاقە ژوورە شوێنی خەوتن و نان و چێشت و خۆشۆرین و هەموو پێویستیەکی ئەم خێزانە گەورەیە بوو ..

پیاوە بەوپەڕی دڵدامەزراویی و هێمنیەوە ژیانی ئەدایە سەر .. بە بێ ئاوڕدانەوە و دوودڵیی و تەممەڵیی کردن سەرگەرمی کاری خۆی بوو .. چەرمەسەریی ژیان بێزاری نەئەکرد و لە هەوڵ و کۆششی بێوچان نەئەکەوت.

هەموو ئێوارەیەك دوای خۆراوا بوون کە ئەگەڕایەوە ماڵەوە و سەوزە و نان و گۆشتی پێ بوو ، ئەندامانی خێزانەکە هەموویان بە چەپڵە و گۆرانیی و خۆشییەوە

ئەهاتن بە پیریەوە و ئەو خۆراکەی کە بە دەستیەوە بوو لێیان وەرئەگرت و بەوپەڕی شادمانیەوە رایان ئەکرد بۆ لای قابلەمەکە و دەستیان ئەکرد بە ئامادە کردنی نانی ئێوارە ..

بەڵام ئەم هەژارە وە نەبێ توانیبێتی هەموو رۆژێ گۆشت بکڕێت و بیهێنێتەوە بۆماڵەوە ، بەڵکو تەنها ئەو رۆژەی بازاڕی باش بوایە و قازانجی بکردایە ئەیتوانی گۆشت بکڕێت ، ئەگینا ناچار ، ئەبوایە خۆراکی ئەو ئێوارەیەی خێزانەکەی لە پاشماوەی ئەو میوە و سەوزەیە بوایە کە لە دووکانەکەی ئەمایەوە و نەئەفرۆشرا ..

ئەم خێزانە بەم بارەیانەوە خۆش گوزەران بوون .. بەختیاریی و شادمانیی رژا بوو بە سەریانا .. وایان لێك نەئەدایەوە کە کەسێکی تر و خێزانێکی تر ژیانی لەوان خۆشتر بێت .. هۆی ئەم بەختیاریەش بۆ گەورەی خێزان ئەگەڕایەوە .. چونکە بە ڕاستیی خواناس بوو .. خەم خۆری ژیان و گوزەرانی ماڵ و منالی بوو .. زۆر بە

تەنگەوە بوو تا حەڵاڵیان دەرخوارد بدا •• بە بەشی خوا رازیی بوو •• لەگەڵ ئەوەشا بە رەفتاری جوانی ، خێزانەکەی فێری خۆشەویستیی و ڕێزگرتن و بە یەکابوون کردبوو ••

ئەبێ ئەوەشمان لە یاد نەچێ خێزانی ئاوا گەورە یەکێتیی و کامەرانیی تیا جێگیر نابێ هەتا کەیبانووی ماڵیش دەستێکی باڵای نەبێ لە پەروەردە و ژیربیدا •• چونکە هەرگیز دەوری کەیبانوو لە هی گەورەی خێزان کەمتر نیە •

ئەندامانی خێزانی بەختیار ئەیانزانیی کەم خێزان هەیە وەك ئەوان هەژاری کەم خۆراکیی و کەمبەرگیی بێت •• بەڵام دڵی فراوان و پاکیان ئەمەی تیا نەئەمایەوە و خەندە لە سەر لێویان نەئەبڕا •• چونکە ئەیانزانیی بەرگ و خۆراکی زۆر و خانووبەرەی قەشەنگ مەرجی بەختیاریی نیە •

بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە یەکێ لە دراوسێکانیان

حاکمێکی دادگای بەرز بوو کە خاوەنی دڵێکی بە سۆز بوو و زۆر بەزەیی بەو خێزانە هەژارەدا ئەهاتەوە و بەینا و بەین سەری لێ ئەدان ..

ئەم حاکمە زۆرجار باسی ئەو دراوسێیەی ئەکرد و ئەیوت :

« لە ژیانما خێزانی وا بەختیارم نەدیوە .. وە خۆشیی و شادمانیم نەبینیوە وەك ئەو خۆشیی و شادمانیەی کە باڵی ئەکێشا بە سەریا ، کە ئێواران پیاوەکە لە دووکان ئەگەڕایەوە .. زۆرم پێ خۆش بوو کاتێکی پڕ بەختیاریم بە سەر بردایە لەگەڵیانا کاتێ کە ئەگەیشتەماڵەوە و ئەندامانی خێزانەکەش هەموویان بە جارێکا بەوپەڕی خۆشیی و هێمنییەوە پێشوازیيان لێ ئەکرد ، ئینجا بە بێ وەستان دەستیان ئەکرد بە ئامادەکردنی خواردنی شێوان.. جا کە خواردن پێ بگەیشتایە لە قاپێکی گەورەدا هەموویان پێکەوە دەستیان ئەکرد بە خواردنی و کە لێیش ئەبوونەوە سوپاس و ستایشێکی زۆری خوایان ئەکرد ..

ئەوسا بە شادمانیی و قەناعەتەوە ئەچوون بۆ ژێر نوێنـــە شرەکانیان و تەنها داوایـان لە خوای گەورە ئەوە بوو لێیان رازیی بێت و دڵیـان تەنها بە خۆیەوە ببەستێت و لـە رۆژی دوایشدا بـە بەهشتی بەرینی خۆی شادیـان بکات ..

مانگ و ساڵ بە سەر خێزانی بەختەوەردا تێ ئەپەڕیی بێ ئەوەی دڵیـان لـە ئاستی یەکدا گەرد بگرێ .. وایـان ئـەزانی لـە بەهەشتێکی بچکۆلەدا ژیـان ئەبەنە سـەر .. کۆڕیەکان بەرە بەرە گەورە بوون و یەك لە دوای یەك نرانە بەر خوێندن.جا وەك ئەڵێن : «قەدری زێڕ لای زەڕنگەرە» ئـەمانیش بـەوپـەڕی هیممەتەوە کۆششیان ئـەکـرد تـا دواڕۆژێکی بـاش وەدەست بێنن و پشـــوویەك بـە خێزانی هەژار بدەن،زیاد لەوەش خزمەتێکی مرۆڤەکانی تر بکەن.. چونکە دڵی پاکی پەروەردەکـراوی ئـەوان لـەم سۆز و هەستە بەرزانە بەولاوە هیچی تری تیـا نەڕوا بوو ..

بـەڵام لـە بـەر ئـەوەی ئـەم بوونـەوەرە فراوانـە دروستکراوی دەستی بـە دەسەڵاتی پەروەردگارە و هـەر

ئەبێ کۆتاییشی پێ بێت ، کەواتە ئاساییە چی وا لە بوونەوەردا ئەبێ دوای تەواوکردنی ماوەی دیاریی کراو بۆی ، کۆتایی پێ بێت و ماوە بدا بەوانەی دوای خۆی ، تا ئەوانیش دەوری خۆیان ببینن و هی تریش بێت بە دوای ئەوانیشا ٠

ئەوەبوو لە رۆژێك لە رۆژەکانی پاییزدا ، ئەندامانی خێزانە هەزارەکە لە بەر دەرگادا وەستا بوون و چاوەڕوانی سەرۆك خێزانیان ئەکرد تا بگەڕێتەوە ، سەیر ئەکەن وا چەند پۆلیسێك هاتن و تەرمێکیان وا بە سەر شانەوە ٠

تەرمی سەرشان بەرەو ماڵی ئەوان ئەهات ٠ گەیشتە بەردەرگا و بۆیان روون بوویەوە کە سەرۆکو بەخێوکەری خێزانەکەیانە ٠٠ باوکی ئازیز و خۆشەویستیانە ٠٠

سەر لە ئێوارە دووکانی داخستبوو و دوای کڕینی گۆشت و نان و هەڵگرتنیان لەگەڵ پاشماوەی سەوزەی دووکانەکەیا ، ویستبووی بەرەو ماڵ بگەڕێتەوە ٠٠ کاتێ ئەیەوێ لە شەقامەکە بپەڕێتەوە ئوتومبێلێکی سەرکەش

گورمیشی ئەبێ و ئەمیش ماوەی خۆ لادانی نامێنێ و پیایا ئەماڵێ و دەس بە جێ گیانی دەرئەچێ و خواردن و میوەکەی بە سەر شەقامەکەدا ئەپژێ .. تەرمیان بردە ماڵەوە ناو خێزانی هەژار ..

خوایە یارمەتیت .. گەورەی خێزان مابوو ئاوا هەژار بوون ، داخۆ لەمەو دوا چی بکەن ؟

خوایە کۆمەکیی و بەزەییت ..

دەر و دراوسێ لە دەوری تەرم کۆبوونەوە و دەست رۆیشتووەکانیان هەندێ پارەیان کۆکردەوە و بە بەشێکی کفن و دەفنی موسڵمانەیان پێ کرد و ئەوەیش لێی ماوە کە پارەیەکی زۆر کەم بوو دایانە خێزانی داماو .. ئیتر ئەوە بوو لە رۆژی دووەمدا خوا لێ خۆش بوویان بە گڵ سپارد و بۆ دوا جار خوا حافیزیان لێ کرد ..

خێزان بە جارێکا هەتیو کەوت .. دووکان داخرا و ئەو جۆرە کاسپیەشیان بڕڕا .. وە گەورە کوڕی خێزانەکە

تەمەنی پانزە ساڵان بوو و قوتابی پۆلی دووەمی ناوەندیی بوو ، کە بە ئاوات بوو قوتابخانەی ئامادەیی تەواو بکا و خۆی بە مووچەخۆرێکی بچووك دا بمەزرێنێ تا بەو مووچە کەمەی یارمەتیی و کۆمەکیی پێشکەش بە خێزانەکەی بکا.

لە کاتێکا باوکی لە ژیانا بوو نەیئەوێرا بیر لە خوێندنی بەرز بکاتەوە ، تا رۆژێ زووتر ئەرکی لە ئەستۆی خێزانی هەژارا نەمێنێ و رۆژێ زووتر دەستی یارمەتیان بۆ درێژ بکا .. داخۆ دوای مردنی باوکی ئەبێ چۆن بیر لە خوێندن بکاتەوە ؟!

ئەگەر ئەم بخوێنێ ئەی کێ پاروویە نانی وشك پەیدا بکا بۆ خێزانی داماو ؟!

بە دوو رۆژ دوای مەرگی باوکی ئازیز ، ئەو تۆزە پارەیەش کە دەر و دراوسێ بۆی کۆ کردنەوە تەواو بوو.. بۆ رۆژی سێیەم سەیر ئەکەن هیچیان نیە .. چاریان نیە جگە لەوەی کوڕی گەورە واز لە خوێندنەکەی بێنێ و دەرگای دووکانە بچکۆلەکەی باوکی بکاتەوە و بە وێنەی

ئـەو دەست بداتە سەوزە فرۆشیی ..

خێزانەکە پەروەردەیەکی رێك و پێکیان وەر گرتبوو، چونکە بە راستیی ، گەورەی خێزان مامۆستایان بوو ..

دیـارە مەرجی مامۆستایەتیی زۆر زانین نیە ، بەڵکـو راستیی دڵ و دەروون و ، خۆشەویستیی پێویستە ..

بۆیە بە مردنی باوکە خێزانەکە تێك نەچوو .. بەڵکو هەر وا لـە نێوان خـۆیانا بە بێ دەنگ و قـرە ئـەژیان و کوڕەیش مەردانە خەریکی کاری خۆی بوو بۆ بـە خێـو کردنی دایکی و خوشك و برا وردیلەکانی و هەردوو پووری و نەنکی ، بـەمـە بە یـەکجاریی دەسـتی لـە قوتابخانـە هـەڵگرت ..

وە ئەوە بوو هەموو ئێوارەیەك دوای خۆراوا بـوون وەك باوکی خوالێخۆش بووی ئەگەڕایەوە ماڵـەوە و ئـەو رۆزیەی کە خوا پێی بەخشیبوون بۆی ئەهێنانەوە ..

بەڵێ ئەمان بە کاری خـوا رازیی بـوون ، بەڵام بـە

کۆچکردنی گەورەکەیان زامێکی سەخت بوو بوویە جگەریان ..

خەندەی سەرلێوەکانیان ، هەڵپەڕکێی مناڵە وردیلەکان و وەستانی بەردەرگایان بە شادمانییەوە هەمووی نەما ..

هەرچی تێوارەیەك دا ئەنیشتن و لە دەوری قاپە گەورەکەدا کۆڕیان ئەبەست نان و فرمێسکیان ئەخوارد ..

بەڵێ هەموو کەسێ خۆشەویستی ئەمرێ .. بەڵام خۆشەویستی ئەمان جیاواز بوو .. با هەزار و کەم دەست بوو .. بەڵام بە زیربی و سەلیقەی خۆی شادمانیی و بەختیاریی پەخشانی ماڵ و خێزان کردبوو ..

بەڵێ خۆشەویستی ئەمان وەك هیچکەس نەبوو ، چونکە کەم کەس ئەیتوانیی ئەو رێز و خۆشەویستیە پێشکەش بە خێزانەکەی خۆی بکا ..

بەم شێوەیە بە کۆچکردنی تاقە دڵسۆزیان بۆ دواجار خەندەی سەر لێویان گۆڕرا بە گریە و شیوەن ..

خۆشیی و شادیان گۆڕرا بـە خـەم و خەفـەت ..
بەڵام ئەوەی کە بۆیان مابوویەوە یـەکێتیی خێزانەکە بـوو
کەوا دایکە توانیی بە ژیریی و سەلیقەی خۆی دەست بگرێ
بـە سەر ئەو کووژەڵە خێزانەدا و نەیەڵێ کەسیان لە ئاستی
کەسیان دڵی گەرد بگرێ .

تـا کاتی بەختیاریان بوو پێکەوە ئەژیان و کاتێ شیوەن
و گریەشیان بوو هەر بـا پێکەوە بن ..

# بڕیاری ناچاری

ڕۆژان تێ ئەپەڕین ، بەڵام ئەگەر بـە لای هەندێکەوە خۆشیی و شادمانیی بوو بن ، بە لای خێزانی لێقـەوماوەوە ، فرمێسك بوون .. بە هەر حاڵ سێ ســاڵ بەم شێوەیە تـێ پەڕیی و کوڕی گەورە تەمەنی گەیشتە هەژدە ساڵیی و کاتێ ئـەوەی هـات بانگ بکـرێ بۆ ئـەنجامـدانی خزمـەتی سەربازێتیی ..

بـۆ جاری دووەم گوزەران و ژیانی خێـزانە کەوتە مەترسیی .. کوڕی گەورە لە دووکان دەرکێشرا و کرایە سەرباز و دەرگای دووکان داخرایەوە ..

ئەندامانی خێزان خەم و خەفەتێکی زۆریان خوارد بۆ

دوور کەوتنەوەی کوڕی نەوجەوان و نازدارپەروەردە و بۆ داکەوتنی دەرگای دووکان بۆ جاری دووەم ..

بەڵام چار نیە .. ژیان و گوزەران بەیەك تەرز نابێت .. ژیان چەندێ ناخۆش و ناڕەحەت بێ لەوەش خراپتر هەیە .. بۆیە ناچار بوون شان شل کەن بۆ کارەساتی رۆژگار و مەردانە دان بگرن بە خۆیانا و بە زیرانە نەگبیر و راوێژی خۆیان بکەن تا بە بێ دەنگ گرێ کوێرەی ژیانیان چارەسەر کەن و کەس پێیان نەزانێ و دەنگیان لە ماڵ دەر نەچێ ..

بۆیە کۆ بوونەوە تا بەرا گۆڕینەوە بکەنە ئەنجامێك بۆ بە ڕێوەبردنی ژیان و گوزەرانی خۆیان ، خۆ لەوە ئەچوو وا هاتبووە پێش بۆیان بێجگە لە خوا کەسێکی ئەوتۆ نەبوو تا کۆمەکیەکیان بکات ..

هاتنە سەر ئەوەی ئایا کوڕی دووە میش ناچار بکەن واز لە قوتابخانە بێنێ و بچێتە سەر دووکانەکەیان ، لە

کاتێکا کوڕە وا لــە پۆلی چوارەمــدا و تاقە ســاڵێکی مــاوە خوێندنی ئامادەیی تەواو کــا ؟!

خۆ ئەگەر ئەم رایە پەسەند نیە و خوا رابەردار نیــە ئــەو رەنجە بفەوتێنن ئەی چی بکەن و کێ خەمی ژیــان و گوزەرانی ماڵەکە بخوات ؟!

سەرەنجام دڵیــان رێی نەدان رەنجی کوڕە بسووتێنن و بڕیاریان هاتە سەر فرۆشتنی خانووەکە و لێی دەرچن ..

جــا بۆ کوێ بچن ؟

ناچارن ! ئەمە تاقە چارەسەرە بۆیان .. هەرچەنـــدە دەرچوونیان لێی وەك کــەوڵ کــردنی مــەڕ وایە و ژیانیان ئەستەمە، وە تەنها ئەو کەلاوە کۆنەیە وا ئەوانی شاردۆتەوە، بەڵام رێگایەکی تر نیە لــە بەردەمیانا تــا رۆژانــی رەشــی ژیانی پێ پینە بکــەن ..

کوڕی گەورە بووە سەرباز و لە شارێکی تری نزیکدا دەستی دایە مەشق و پرۆفە لە سەر بە کارهێنانی چەك ..

کوڕە هەر بە لاشە سەرباز بوو ، لاشەیەکی بێ ئاگا ، چ فەرمانێکی بە سەرا بدرایە و چ وانەیەکی بە گوێدا بدرایە و چ مەشقێ لە بەرچاویا بکرایە ، ئەو لێی بێ ئاگا بوو و هیچی لێ تێ نەئەگەیشت ، مامۆستای وانە و مەشق ئەمەی هەست پێ ئەکرد و بە گیروگرفتی کوڕەی نەئەزانی .. دەمێ بە ئامۆژگاریی و دەمێ بە سزا و بە ئەرك و فێرکردنی زیاتر لە گەڵیا خەریك ئەبوو و ئەهات بە سەریا ، بەڵام بێ هوودە بوو .. نەیئەزانی کوڕی داماو بیر لە چیی ئەکاتەوە ؟ نەیئەزانی خێزانێکی بێ داڵدەی بە جێ هێشتووە و ه واڵیان نازانێ و هەموو هۆش و بیرێکی وا بە لای ئەوانەوە .

ئەوە بوو دەنگ و باسی گەیشتە لای ئەفسەرەکەی و پرسیاری گیروگرفتەکەی لێ کرد ، ئەمیش دڵی خۆی بۆ کردەوە و گرێ کوێرەکەی دڵی باس کرد بۆی . ئەفسەرەکە خاوەنی هەستێکی بزواو بوو ، بۆیە بەزەیی پیا هاتەوە و دڵخۆشیی دایەوە و ئیتر لەوەو دوا سەری نەئەخستە سەر بۆ فێر بوونی وانە و مەشقەکانی . لەگەڵ

ئەمەشا گیروگرفتەکەی گەیانـدە لای فـەرماندەکـەی و ئەویش فەرمانی دا ئەرکێکی ئاسـانی بـۆ دیاریی بکەن تـا لەش و مێشکی پشـوویەك بـدەن • ئـەوە بـوو ناردیانـە چێشتخانەی سەربازگەوە تـا ئەرکی کـەم بێت و جـۆرە یارمەتیەك بێت بۆی ••

لـەو لاوە دایکی داماویش ، هەر چەندە دانـا و زانـا و سەلیقەدار بوو و ئەرك و خەفەتی بەخێو کردنی خێزانەکـە لـە ئەستۆیا بوو ، هەر بـە لاشە لە ماڵەوە بوو •• هـەموو هەست و هۆشێکی بە لای کوڕی ئاوارەی بێ کەسی بـێ دەرامەت و خەرجییەوە بوو ••

کورتەکەی چاوەڕوانی دەستی پەروەردگار بـــوون دەرووبان لێ بکاتەوە ••

بـەڵام نەخشەکانی خوا زۆر رەنگینن •• بـە ئارەزوو و ویستی مرۆڤ نین •• بەڵکو بە ویستی پەروەردگارن کە هەموو ویستێکی پڕە لە دانایەتیی و تەنها دڵی ئیماندارەکان پێیان ئەحەسێتەوە !

دایکە ناچار بوو هەندێ پارە بە لای یەکێ لە دەڵاڵەکانی خانوو فرۆشتنەوە قەرز بکا هەتا کاتێ خانووەکەیان بفرۆشرێ ، بۆ ئەوەی بیکاتە خەرجی خێزانەکەی • بۆیە سەنەدی خانووەکەی کردە بارمتە بەلای دەڵاڵەوە و خانووەکە خرایە مەزاتی فرۆشتنەوە •

ئەوەی کە دایکەی هان ئەدا بۆ فرۆشتنی خانووەکە ئەوە بوو بتوانێ بە بەشێك لە نرخەکەی لە باتی سەربازیتیی ( بدل ) بدا بۆ کوڕە سەربازەکەی بەڵکو رزگاری بێت و بێتەوە سەر دووکانەکەیان و وەك جاران ئیشی لە سەر بکات ، تا هیچ نەبێ لە زیانە کولەمەرگییەکەی جارانیش بێبەش نەبن ، تا بەڵکو بە هەر شێوەیەك بووە، خوا کۆتایی پێ بێنێ بۆیان و دەرووی بە خێریان لێ بکاتەوە ••

خانوو کەوتە مەزاتەوە و کڕیاری لێ کۆبوویەوە •• سەرەنجام دوای تێپەڕبوونی بیست رۆژ خانوو فرۆشرا بە چوار صەد دینار ، ئینجا نۆ رۆژی تریشی پێ چوو هەتا

لـە ئیش و کاری ناوگۆڕینی خاوەنێتیی بوونەوە و کرا بـە نـاوی کڕیارەوە ، ئەوسا نرخی فرۆشتنەکەی وەرگرت ..

ماوەی وەرگرتنی « بەدەل » یەك مانگ بوو ، ئـەوە بوو تـا خانوو فرۆشـراو پارەکـەی وەرگیرا بیست و نـۆ رۆژی بە سەرا چوو ، وە تەنها یەك رۆژی مـا بـوو بـۆ وەرگرتنی پارەکە .. بۆیە دایکە ناچار بوو هەوڵ بدا هەر ئـەو تێوارەیە ، کـە رۆژی بیسـت و نـۆ بـوو ، خۆی بگەیەنێتە ئەو شارەی کوڕەکەی تیا سـەرباز بوو تـا لـــە رۆژی سیهەمیندا پارەکە بدات . خۆ ئەگەر ئەو رۆژە فریای وەرگرتن نەکەون ئەوا ئیتر لێیان وەر ناگیرێت و مەگـەر دوو ساڵی تەواو لـە سەربازێتیدا بمێنێتەوە ..

# تۆڵەی ناپاکی

دایکە ناچار بوو هەر ئەو ئێوارەیە بچێتە گەراجـی ئـەو ئۆتومبێلانەی کە هاتوچۆی ئەو شـارە ئەکـەن کـە کوڕەکەی لەوێ سەربازە . سەیری کرد ئۆتومبێل هـەیە بـەڵام نەفەریان دەست ناکەوێ ..

کات هاوین بوو .. بەرە بەرە رۆژ بەرەو تەواو بوون ئەچوو و ئەوەندەی نەما بوو خۆر ئاوا بێ .. کەچی تـا ئەو کاتەش تاقە رێبوارێك نەهات .. زۆر پەرێشان بوو .. ئـەت وت وا بـە سەر دڕکەوە .. هەر چاوەڕوان بوو .. بـەڵام بـە بێ هوودە .. خۆریش ئـاوا بوو .. مـاوەی نێـوان هەردوو شارەکە نزیکەی دووصەد و چل کیلۆمەتر ئەبـوو و بـە دوو سەعات و نیو ئینجا بە ئۆتومبێل ئەبڕڕا .. خۆ

ئەگەر ئەو شەوەش نەگەیشتایە ئیتر فریای کوڕەکەی نەنەکەوت .

بۆیە ناچار بوو بە تەنیا ئوتومبێلێك بە کرێ بگرێت و بەو شەوە و بەو پەلە پەلە بکەوێتە رێ ..

سۆزی دایك و باوك سنووری بۆ نیە ، هەتا جاری وا ئەبێ ژیانی خۆیان ئەخەنە مەترسییەوە لە پێناوی خۆشبەختیی کۆرپەکانیاندا ..

خاوەنی ئوتومبێل کرێی تەواوی لە ئافرەتەکە وەرگرت و بەو شەوە کەوتە رێ .. رێگاکە بە ناوچەیەکی شاخاویی زۆر سەختا تێ ئەپەڕی .. لە رێگادا قسەیەك لەم و یەکێ لەو باس هاتە ناوەوە و شۆفێر لە مەبەستی پەلەکردنی ئافرەتە تێ گەیشت و زانی کەوا صەد دیناری پێیە ..

خۆ ناشکوریی نەبێ زۆربەی ئەندامانی ئەم کۆمەڵەمان لە ئامۆژگارییەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ـ صلی اللە علیە وسلم ـ بێ ئاگان و مردن و

زیندووبوونەوە و لێپرسینەوەی قیامەتیان بـە بیرا نایـە ..
شۆفێریش لەو جۆرانە بوو کە ترسی خوای لە دڵا نەبێ ،
بۆیە تەماعی صەد دینارە گرتی و کەوتە نەخشەکێشان بـۆ
ئـەوەی لـە ئافرەتی بەستەزمانی بسـێنێ ..

مـــرۆڤ کـە خـوای لــە بیر چوویـەوە هـەموو
خراپـەیەکی لێ ئەوەشێتەوە ..

ئیتر نەئـەهات بە بیری شۆفێـردا ئـەو بەشی خـۆی
دەستهاتی هەیە و خوا بەخششی زۆری پێ بەخشیوە و ئەم
بەستەزمانەش ئەوە گوزەرانی مـاڵ و مناڵ و بێ تفـاقیی و
خانووفرۆشتن و بێدالدەیی خێزانەکەیەتی و بەم صـــەد
دینارە و لەم شەوەدا ئافرەتی بەستەزمان ئەیەوێ ژیانی ماڵ
و مناڵی بسێنێتەوە ..

خۆ چاك لـە دەنگ و باس شـارەزا بـوو .. بـەڵام
ئادەمیزادی بێئیمان زوو بە زوو بۆ شەیتان تـەخـەڵەتێ !

زوو بـە زوو تەماع چاوی کوێر ئەکا !

دەنگی نەکرد هەتا گەیشتنە پێچێك کەوا لەوێدا
ەنیشتی لای راستی رێگاکە بریتیی بوو لە شیوێکی سەختی
، وول ..

ئوتومبێلەکەی لە ناکاوا وەستاند و دابەزیە خوارەوە
، دەرگای لای ئافرەتەی کردەوە و دەستی دایە پەلی و بە
زۆر رای کێشایە خوارەوە و بۆ ماوەی بیست مەترێك بە
بێ بەزەیی بە دوای خۆیا کێشی کرد ..

هاوار و نزا و پاڕانەوە و لاڵەی ئافرەتی بێ کەسی
بێ چارەی لێقەوماوی هەتیوبار لەو شوێنە چۆڵە و لەو
تاریکە شەوەدا دادی نەدا و سۆز و هەستی ئادەمێتیی لە
دڵی شۆفێردا نەبزواند و بە هیچ شێوەیەك رای ناموسڵمانانەی
خۆی نەگوڕیی ..

لە بەر بێ کەسیی بوو جیهانی ئیسلامیی ، وا سەگ
و گورگی کافران هێرشیان هێنا و هەموو بێ خوایەکیان
لە ناومانا رواند ..

شەوی تاریك و دۆڵی چۆڵ و هۆڵ و دایکی خەمبار و

و هەتیوبار •• توخوا کێ بێ خۆی لـە تاوانی وا بدا جگە لـە کەسێك کە زەرپەیەك ئیمـان لـە نـاو دڵیـا دەسـت نەکەوێت ؟

خوایە نەخشەکانت زۆر رەنگینن ، و ئێمـەی پەلەکەر و بێدەروون پەلەمانە تۆڵەی بسێنی ••

شۆفێری نـاپـاك و تاوانکار خـەنجەری لـە ئافرەتی بەستەزمانی بـە ئاوات نەگەیبو راکێشا و دایگرتەوە •• نە جارێك و نە دووان •• تـا ئافرەتە شل بـوو و لەو دۆڵـە تاریکەدا خوێنی سەری کرد و کەوتە سەر زەویی ••

خوایە بەزەییت •• لەم هەڵوێستە ناسك و نالەبـارەدا کێ ئەتوانێ بگاتە فریای ئافرەتێکی لێقەوماو ؟

بە شل بوونی ئافرەتەکە ، شـۆفێر بێخەم بـوو کـەوا بـە تەواویی گیانی دەرچووە و لێ بۆتەوە ، بۆیـە دەستی دایە باخەڵی و پارەی دەرهێنا و بە هەناسە برکێ و عارەقی خـەجاڵەت و دەروونـی تاوانکـار و رەنگی بزرکـاودوە گەڕایەوە لای ئوتومبێلەکەی •• سواری بوو و ئۆخـەی

کرد که به ئـاوات گەیشت بێ ئەوەی کـەس پێی بزانێ ••
ئیتر بێ ئاگا بوو خوا ئاگاداره•• حیسابی بۆ ئەمە نەکرد ••
تەنها خەڵـکیی ، یاسا ، پۆلیس نەزانن ، ئیتر مـەترسیی نیـا
نیـە •• چەند جار تاوانی کردبێ و هیچی بە ســـــەرا
نەهاتبێ •• چەند کەسی دیبێ و لـە تـاوان و خراپەدا تـا بینە
واقە چەقیبێ و کەچی هەر بێ وەی ســووڕابێتەوە ، بۆیـە
لـە لایـەوە تۆڵـەی پـەروەردگار هـەر پێویســـتی بـە
بیرلێکردنەوە نەئەکرد ••

بەڵێ سواری ئوتومبێلەکەی بوو و صەد دینارەی تایە
تەنکەی باخەڵیو ئافرەتی داماوی بەو شەوە بە تاقی تـەنیـا
بەجێ هێشت کە خوێن لـە زامەکانی ســەری کـردبوو و
گۆمێکی لێ دروست بوو بوو و هەژارەی تیا ئەگەوزایەوە••

دۆڵـەکە زۆر سەخت و چۆڵ بوو •• جگە لە گیانداری
کێویی کەس لەوێوە گوزەری نەئەکرد ••

شۆفێر بەرەو ئەو شارەی کە بۆی ئەچوو کەوتە رێ،
چونکە ترسا کە ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ شـاری یەکـەم ئـەم

ناپاکییەی ئاشکرا بێ : یەکەم بە بەتاڵیی ئەگەڕێتەوە و دووەمیش ئەو ماوەیەی کە پێی ئەچێ ئەوەندە نابێ بۆ ئەمسەر و ئەوسەر و لێی ئەکەونە گومانەوە •

دیارە هەرکەسێ شەیتانی کردە مامۆستای خۆی و بە نەخشە گڵاوەکانی ئەو چوو بە ڕێوە ، ئەویش دەستبەرداری نابێت وخێرا خێرا فڕوفێڵی پیشان ئەدا تا لە خۆی بایی بێ و خوای بە یەکجاریی لە یاد بچێتەوە ••

کاتێ گەیشتە شار خۆی گەیاندە گەراج و بە هاوەڵەکانی ڕاگەیاند کەوا ڕێبوارەکانی لەم بەری پردەوە دابەزاندووە بۆیە کەسی لەگەڵا نیە •

سەیری کرد بە پێچەوانەی گەراجی یەکەمەوە نەفەر زۆرە و چاوەڕوانی ئوتومبێل ئەکەن • چەند کەسێکیان سەرکەوتن و بە بێ وەستان بە هەمان ڕێگادا گەڕایەوە •

خەندەی سەر لێوی ئەهات •• خۆی بە پاڵەوانی مەیدان ئەزانیی •• هەر ئەوە نیە گیرفانی پڕبێت ؟! خەڵکیی بە ڕۆژا کاسپیی دەست ناکەوێ ، کەچی ئەم بە شەو و

بــه رۆژ هەر بۆی ئەبــارێت !!

ئادەمیزاد کە خوای لــە بیر چۆوە، دەستی لێ بشۆ..

فیرعەونێکە بۆ خۆی، بڕوا بە کاتی دەست نەڕۆیشتنی مــەکــەن ..

هاتن تــا گەیشتنە ئەو شوێنەی کە بە نامەردانە خۆی بــردە ریزی قابیلەوە .. گەیشتنە ئەو شوێنەی کە شەیتان ئۆخەی کرد و بە شادمانییەوە دەستی هێنا بــە سەر دڵیــا ..

نەفەرەکان ئاگایان لە هیچ نیە .. شەو زۆر درەنگە.. ئوتومبێلەکەی وەســتاند و بێ ئــەوەی بــە نیازی گــلاوی بزانن دابەزی و تێی گەیاندن ئەیەوێ دەست بە ئاو بگەیەنێ و بــە زووترین کات ئەگەڕێتەوە !

بەرەو ئافرەتە بەستەزمانەکە کەوتە رێ و بــە ســەر دۆڵــە سەختەکەدا ملی شۆڕ کردەوە . ئــەوەی کــە لــەو سەردەوە پێی کرد بوو کەم بوو !! ماوێتی یارمەتی بــدا لــە هەڵسووڕاندنی کاروباری هەتیوەکانیدا !! خـوا کاری بــە

خێر بگێڕێ ئەویان پێ نەگەیشتایە پەکیان بوو !!

لێی چووە پێشەوە ، سەیر ئەکا بە حاڵ و ناحاڵ
نووزەی لێ دێ ‥ ئەوەندەی ناڵاند بوو لەو دۆڵە چوڵە
تاریکەدا هیلاك بوو بوو و چی تر دەنگی دەر نەئەهات ‥

جا بناڵێنێ و نەناڵێنێ بە چی ئەچێ ؟!
کێ بگاتە فریای ؟!

ئەو مێردەی کە هەموو ڕۆژێ خەندەی ئەخستە
سەر لێویان ؟!

کوڕی گەورەی خەمخۆری خێزان ؟!

باوك و برا ؟ خاڵۆ و مامە ؟! خزم و کەس و کار ؟
خوایە دەروونت فراوانە ‥ نەخشەکانت ڕەنگینن .
بە دانایەتیی بڕیار ئەدەی ‥
**خوایە هەر خۆت خوای !**
خوایە هەر خۆت پەنای !
خوایە هەر خۆت فریاکەوی !

خوایە هەر خۆت بڕیاردەری !

لـە ئافرەتی بێچارە چووە پێشەوە و پێی وت :

« نەفرین لێ‌کراو ! ئەوە هێشتا هەر زیندووی ؟ » .

ئافرەتە لـە جێی خۆیا وشك بوو .. لە ترسانا ورتەی

ـە خۆی بڕی ..

ئەمە ستەمکارە خوێنمژەکەیە ..

خۆی ئامادەی داگرتنەوەی دەمە خەنجەر کردەوە .

رووی دڵی کردەوە خوا ..

پـەنـای بردەوە بـەر ئەو هێزەی ملهوڕانیش لە کاتی

بێدەسەڵاتیانا ئەکەوێتەوە بیریان و پەنای پێ ئەبەن ..

خوایە بێ‌کەسم خۆت کەسم بـە ..

خوایە بێ‌پەنام خۆت پەنام بە ..

ئافـرەتی بێدەسەڵات نەیئەتوانی ئەم رستانە بـە زمان

بڵێت ، بەڵام بـە بیرکـەوتنەوەی خـوای بەدەسـەڵات و

دڵ‌بەستن بە هیوای کۆمەکیی و پشتیوانیی ئەوەوە ، واتایان

دەر ئەکەوت ..

ستەمکاری خۆینڕێژ ، لاشەی بە حەرام پەروەردەی بە فیزێکەوە چەماندەوە بە سەر بەردێکی زلەدا و ویستی هەڵی گرێ و بیکێشێ بە سەری ئافرەتی لاشە پڕ لە زامدا ..

هەر ئەوەندە دەستی گەیاندە بنی بەردەکە ، یەك هاواری زلەی کرد و بە هەموو هێزی نرکاندی !

ئەکەی پاڵەوان ! هاوار و نرکە بۆ تۆی پاڵەوان نەهاتووە :

ئەکەی دڵ بدەی بە دڵ ئافرەتێکی زامداری بێدەسەڵات کێی هەیە بگاتە فریای !!

مەترسە !

باکت نەبێ !

هێز کوا چاری تۆ بکا !!

بە نرکەی خوێنڕێژ ئەمبەر و ئەوبەری دۆڵەکە دەنگی دایەوە ..

ترکەکەی چەند جار ئەمسەر و ئەوسەر و ئەمبەر و ئەوبەری کرد ..

نەفەرەکان دەنگەیان بیست ..

بە پەلە و بە هەڵەداوان هاتن بە دەمیەوە .. حەپەسان ! چیی ئەبینن ؟

سەیریان کرد ئەو بەردە زلەی کە شۆفێر ویستوویەتی هەڵیگرێ و سەری ئافرەتی پێ پان بکاتەوە ، ئەژدیهایەکی لە ژێرا بووە و کەڵبە ژەهراویەکانی بە دەستە تاوانبارە خەنجەروەشێنەکەی گەیاندووە و گەستوویەتی .. وە هەروەك خوا حەز بکا لە تەنیشت ئافرەتەدا کەوتووە بە گازەرەی پشتا و هاوار و ناڵەی ئەچێ بە حەوادا ..

خوایە هەر خۆت خوایت ..

راستت فەرمووە هەموو بوونەوەر و هەرچی وا تیایا هەموی سەربازی فەرمان بەردارتە وەك فەرموتە :

﴿... وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ ...﴾ المدثر/٣١

خوایە هەر خۆت خوایت ..

ئادەمیزاد جێنشینە لـە سـەر زەویـدا بۆ ئەوەی بـە فـەرمانەکانت ژیـان و گوزەرانی پڕ بکا لـە بەختیاریی ..

بـەڵام کە لای دا ئـەبێ راست بکرێتەوە .. سـزا بدرێت .. تۆڵەی لێ بسەنرێت ..

بـە چی ؟!

بـە هەموو شتێك .

بـە بوومەلەرزە ..

بـە جەنگ و کوشتاری بێ ئەنجام ..

بـە لافـاو ..

بـە نەخۆشیی ..

بـە رەشەبا ..

بـە بەردباران ..

بە ئەزدیها ..

ئافرەتی زامداری هەتیوبار ئەوەندە خۆی بە شیاو نەئەزانی وا خوا خێرا تۆڵەی بسێنێ !!

بەڵام سۆزی خوا بێ سنوورە ..

تەنانەت ناڕەزایە ستەم لە خوانەناسانیش بکرێت !!

خوایە ، خوا ..

بوونەوەری لە سەر داد و راستیی وەستاندووە ، چۆن ماوەی ستەمکار ئەدات ؟

چۆن دەستبەرداری ستەملێکراو ئەبێت ؟

خۆی لە قورئانی پیرۆزا بڕیاری داوە تۆڵە لە ستەمکاران بکاتەوە و کەسیش نەتوانێ بەری دەستی بگرێت .. کە فەرموویەتی :

..إِنَّا مِنَ ٱلْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ ﴿٢٢﴾ السجدة

وه فـەرموویەتی :

﴿... وَلَا يُرَدُّ بَأْسُنَا عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١١٠﴾﴾ يوسف

نەفەرەکان شۆفێری گەزراو و ئـافرەتی زامداریـان بردەوە سـەر ڕێگاکە و چاوەڕێی ئوتومبێلێکی تریـان کرد تـا بێت ..

لـە هەر کوێوە بێت گرنگ نیە ..
گرنگ نیە بۆ هەر شارێك بێت ..
بـە مەرجێ بگەنە خەستەخانە ..

خوا وای ڕێکخست یەکـەم ئوتومبێلێ کـە هـات بۆ ئەو شارە ئەچوو کە کوڕی ئافرەتە زامدارەکـەی تیـادا سـەربـاز بـوو ..

وەستاندیان .. داوایان لێ کرد ئـافرەتی زامـدار و شۆفێری ماران گەستوویان بۆ بگەیەنێتە خـەسـتەخانە ..

شۆفێری تاوانبار لـه ڕێگادا دوا هەناسـەی ژیانی دا و سـەری شۆڕ و پڕ لـه خەجاڵەتیی نایەوە ‎٠٠‎ ژەهـری ئەژدیها لەوەدا نەبوو کەس بەرگەی بگرێت ‎٠٠‎

هەڵبژاردە بوو تـا شـایانی دەستی خـەنجەرووەشێن بێت !!

ئافرەتی زامدار گەیشتە خـەستەخانە ‎٠٠‎ پزیشـك و کارگێڕانی خەستەخانە بە پێی پێویست بە کاری سەرشانیان هەڵسان ‎٠٠‎ تەندروستیی ئافرەتەکە کەمێك هاتەوە سـەر خۆی ‎٠٠‎ کەوتە قسە کردن و گێڕانەوەی بەسـەرهاتەکەی لـه بـەردەم پۆلیس و لێپرسـراوانی دادگـادا ‎٠٠‎ ئـەوسـا پـارەکەیان لـه گیرفانی شۆفێری قوڕ بەسـەر دەرهێنـا کـە وەهـا لـه تەنکەی باخەڵیـا قایمی کرد بوو ئەت وت عارەقی زەرد و سووری لـه پەیدا کردنیا ڕشتووە ‎٠٠‎

ئینجا ئافرەتەکە داوای کرد بەڵکو کوڕەکەی بۆ ئامادە بکرێ ‎٠٠‎ هەر ئەو شەوە کوڕە ئاگادار کرا و لـه ئاخر و ئۆخری شەودا خۆی گەیاندە خەستەخانە لای دایکی ‎٠٠‎

دایکه دوای گێڕانەوەی چیرۆکی گەشتەکەی بێهۆش کەوتەوە ، بە رادەیەك پزیشك و برینپێچەکان وا تێ گەیشتن لە سەرەمەرگایە و ئەوەندەی بە زیانەوە نەماوە ، بۆیە بە پەلە خوێنیان پێ گەیاند ..

هەروا بە بێهۆشیی مایەوە هەتا لە چێشتەنگاوا چاوی هەڵێنا و بە سۆزێکەوە سەیرێکی کوڕە سەربازەکەیی کرد و پێی وت :

« بە ئورجیی پارەکە بدە » .

هەر ئەمەندەی وت و دیسان چاوی نووقاندەوە و بێهۆش کەوتەوە ..

هەرچۆن بێ دایکە بە ئاوات گەیشت .. پارەی گەیاندە دەستی کوڕە و ئەویش ئەو رۆژە ـ کە دوایین رۆژی وەرگرتن بوو ـ تەسلیمی کرد و خزمەتی سەربازێتیی لە کۆڵ کەوت ، تا بە یارمەتیی خوای میهرەبان بتوانێ خەمێکی خێزانی بێ داڵدە بخوات ..

لەولاوە دایکەش رۆژ بە رۆژ تەندروستیی چاکتر ئەبوو ، هەتا بە تەواویی چاك بوویەوە و خەستەخانەی بەجێ هێشت و گەڕایەوە بۆ شارەکەی خۆیان ، بۆ ناو ماڵ و منالی ..

دەنگ و باسی رزگار بوونی دایکە و مار گەستنی شۆفێری ناپاك لە هەمان شوێنا ، بە هەموو لایەکا بلاوەی کرد .. بووە بنێشتە خۆشەی ژێر دانی هەموو کۆڕێك ..

هەرکەسێ ئەم چیرۆکەی ئەبیست ، لە قولایی دلیا نەخشە رەنگینیی پەروەردگار جێگیر ئەبوو .. دەستی ئەوی ئەبینی .. سەرەنجامی رەشی هەموو ستەمکارێکی ئەهاتە بەرچاو .. کۆمەکیی و سۆز و بەزەیی خوای گەورەی بۆ هەژاران و ستەملێکراوان بە یاسایەکی هەمیشەیی ئەناسی ..

چونکە لە راستیدا تەنها خوا بوو وا ئەو ئافرەتەی رزگار کرد ..

ئەو دۆلەی کە ئەوە تیایا رووی دا بوو ، دۆلێکی

چۆڵ و سەختی بێ گژ و گیا بوو کە هیچ کەسێ رێی تێ نەئەکەوت ، هەتا ئەوەندە چۆڵ و بێ ئاوەدانیی بوو و لە بەر بێ گژ و گیایی شوانەکانیش خۆیان لێ نەئەدا ، بۆیە بوو بووە ماوا و مەنزڵی هەموو درِوندەیەك .. دەی کەواتە ئەو ئافرەتە ئەگەر لەوێ بمایەتەوە مسۆگەر ئەبووە خۆراکی درِوندەکان و کەسێ پێی نەئەزانبی و لە بەر سەختیی دۆڵەکە و بێ هێزیی لاشەی توانای نەبوو هەتا خۆی بگەیەنێتە سەر رێگاکە .. بۆیە ئەگەر شۆفێرە تاوانکارەکە لەو سەرەوە سەری لێ نەدایەوە و بڕۆیشتایە ئەوا باسەکەی کەس پێی نەئەزانی و ئەبووە نهێنیەکی نەزانراو .. هەتا کاتێ مارەکە گەستی ئەگەر ئەو هاوارە زلەی نەکردایە نەفەرەکانیش پێیان نەئەزانی ..

خۆ ئەگەر تاوانکار راستە و خۆ لە پاڵ ئافرەتەکەدا نەکەوتایە ئەوا بە ئافرەتەکە نەئەزانرا چونکە زۆر تاریك بوو .

دیسان ئەگەر یەکەم ئوتومبێل کە هات بەرەو شاری

یەکەم بڕۆیشتایە ئـەوا دایکـە بەرەو ماڵەوە ئەبرایـەوە و نەئەگەیشتە ئەو شارەی کە کوڕەکەی تیایا سەربازە و بەمە ئەو رۆژەی کە مابوو لە کیسیان ئەچوو و پارەکەی فریـــا نەئەکەوت ..

جـا ئەمە پەند و ئامۆژگاریە بۆ هەموو دایك و باوکێك کەوا چاو لە گەورەی خێزانەکە بکەن چۆن بەو هەژاریـە ماڵ و منالی بەو پەڕی بەختیاریەوە بەخێو ئەکرد بێ ئەوەی دەست بەرێ بـۆ پوولێکی حـەرام وە یـا هـەر بیری لـێ بکـاتەوە ..

ئـەمە پەندە بۆیان بـا لـە هەموو بارێکا خوایان لـە یـاد بـێ ..

بـا هەڵپەی حەرام نەکەن بۆ منالەکانیان ..

بـا رێـز و رەوشـت و پـەروەردە بـەجێ بێڵـن بۆ رۆڵەکانیان نەك زێڕ و زیو ..

بـا بە پارووی حەڵاڵ خۆیان و خێزانەکانیان تێر بکەن

تـا له هه‌موو كاتێكا خوا چاودێریان بكا و كه‌م سه‌رشۆڕیی دنیا و قیامه‌ت بێنن به سه‌ر خۆیانا و ئه‌وانیشا ..

چونكـه پیـاوچاكیی بـاوك و دایك ئـه‌بێته مایـه‌ی خۆش گوزه‌رانیی رۆڵه‌كانیان خۆ دیاره پێچه‌وانه‌كه‌شـــی پێچه‌وانـه‌یـه !!

# فەڕ و بەرەکەت

ئەو حاکمەی کە دراوسێی ئەو خێزانە بوو گێڕاویەتەوە :

منیش وەك خەڵکی بەسەرهاتی دراوسێکەمانم بیست - کە شۆفێری خوانەناس دەوری بەدکاری و رووڕەشیی دنیا و قیامەتی تیا بینی - بۆیە لەگەڵ دراوسێکانی تردا هەستاین بە کۆکردنەوەی نرخی فرۆشتنی خانووەکەی هەتا لە خاوەنە تازەکەی بسێنینەوە(١) ..

خاوەنی تازەی خانووەکە ئەویش بەسەرهاتەکەی

---

(١) ئەم رەوشتە بەرزە ئیسلامیە و ئەم لێبووردنە لە کوێ و چاوچنۆکیی ئەوروپا لە کوێ کە تەنانەت منالی خۆیان وکەس وکاری لێقەوماوی خۆیان دەربەدەر ئەکەن ؟!

بیست ، جا ـ ئەویش مەردانە ـ سـەنەد و خـاوەنێتیی خانووەکەی بۆ گێڕانـەوە [ و لـە چوارصـەد دینارەکـەش گـەردنی ئازاد کردن ] .

ئینجا ئەو پارەیەی کـە دراوسێکان کۆیـان کـردەوە بۆیان لەگەڵ سێصەد دیناری پاشماوەی فرۆشتنی خانووەکە [ واتە ئەوەی لـە بەدەلەکە مابوویەوە ] مایەوە بۆیـان و ئـەوانیش هەستان سەر لە نوێ خانووەکـەیان پێ نـازە کـردەوە ..

کوڕی گەورە خزمەتی سەربازێتیی لە سەر شـان لا چوو .. هاتەوە ناو خێزانەکەی .. ئەوە بوو دایکیشـی چاك بوویەوە ، ئەوسا گەڕایەوە سەر دووکانەکەی باوکی و ژیرانە دەستی دایەوە کاسپیی بۆ بەخێوکردنی خوشـك و برا و ئەندامەکانی تری خێزان ..

دوای بیستنی چیرۆکەکەی دایکی لە لایەن خەڵکەوە بووە ناسراوێکی وەها کە خەڵکیی حەزی ئەکرد بە تایبەتیی لای ئەو شت و مەکی پێویست بسێنێ تـا یارمـەتیەك بێت بـۆ

ئەو خێزانە هەژارە بەئارامە ڕەوشت جوانەی کە تـا ئێستا پێی نەزانراوە •• ئەوە بوو بە مـاوەی ســاڵێك کاسپیەکەی پــەرەی سەند •• سامانی بە سەرا ڕژا •• دەوڵەمەند بوو••
دیارە ئەمەش لە پاڵ ڕەوشتی بەرز و دەستی پاك و کڕین و فرۆشتنی موسڵمانانەدا •• تـا وای لێ هات گواستیەوە بـۆ دوو کانێکی گەورە لە شوێنێکی ڕێك و پێك و لــە ســــەر شەقامێکی گشتیدا ••

ساڵ لە دوای ساڵ تێ ئەپەڕی و لـە هەموو ساڵێکدا لایەکی تازەی تر لە خانووەکە بەرز ئەکرایەوە • منداڵەکان یەك لـە دوای یەك خوێندنی قوتابخانەیان تەواو کـرد •• یەکێ بوو بـە ئەندازیار و یەکێ بــە پزیشك و سێهەم بــە ئەفسەر لـە سوپادا ••

کورتەکەی ژیـان و گوزەرانیان خۆش بوو ، لــــە مەینەتیی و دەستکـورتیی ڕزگاریان بـوو •• ئـەو ڕۆژە تاڵانەی ژیانیان بە سەر چوون • کە خۆراکیان بریتیی بـوو لـە نـان و چا وە یـا نـان و سەوزە •• لە لایەن خـوای

گەورەوە خێر و بێریان رژا بە سەردا •• لە چاودێریــی و سۆزی پەروەردگارا نوقم بوو بوون •• لەولاشەوە لــە بەر چاوی خەڵکیا نموونەی رەوشتی بــەرز بوون کــەوا بــەو شێوە پڕ لە ڕێز و سۆزە کۆمەك و یارمەتیی دەری یەکتریی بوون لــە خۆشیی و ناخۆشییدا ••

تا ئەوە بوو لە ساڵی **١٣٨٥** ی کۆچکردنی پێغەمبەری خوادا ـ صلی اللە علیە وسلم ـ خێزانی موسڵمانی خواناس ـ کە بە هۆی موسڵمانیی و خواناسییەوە هــەموو کــاریکی دابووە دەست خوا ـ لەو **خانووەشیاندا گواســتیانەوە** بـــۆ خانووی تازە لە سەر کەناری رووباری دیجلە و نزیــك بــە پردی گەورە لــە بەغداد ، کە بریتیی بوو لە خانــوویەکی پــڕ بەختیاریی و هاوکــاریی و خێــر و خۆشــیی ، دوای ئــەوەی ئەندامانی خێزانەکەیان لە جاران زیاتر بوون و لە خانووی پێشوودا جێیان نەئەبوویەوە ••

ئەوەبوو هەر ئەو خێزانە چوار خێزانی لێ کەوتەوە ، بەوەی کەوا هەرسێ کوڕە گەورەکان ژنیان هێنا و خـــوا

منالّی پێ بەخشین ، لەگەڵ ئەوەشا پەیوەندیی نێوان ئەندامانی خێزانەکە زۆر بە هێزە و بەوپەڕی رێزەوە بە بەختیارانــە ئەژین و دایکی کوڕەکان گەورە و خانمی ماڵــە و هــەموو کاروبارێ بە دەستی خۆیەتی بــە هــۆی دامــەزراویی و دنیادیدەیی کوڕەکانیەوە ..

چیرۆکی ئــەم خێزانــەم لــە هــاوڕێکــەم ، حاکمە گەورەکە ، بیست و حەزیشم کرد خۆم لــە یەکێ لــــە ئەندامانی خێزانەکە ببیستم(۲) ..

پرسیارم کرد لــە کوڕە گەورەکەیان کە ئەوسا سەوزە فرۆشێکی هەژار بوو و ئێستا بازرگانێکی گەورەیــە ، تــا بەسەرهاتەکەی دایکیم بۆ بگێڕێتەوە ، ئەویش وتی : « جــا بۆچ بەسەرهاتەکەی لــە خۆی نەبیستیت ؟ »

ئێوارەیەکیان چوومە ماڵە پڕ ئاوەدانیە رازاوەکەیانەوە کەوا لە سەر رۆخی رووبــاری دیجلــە بوو ، ســەیری

---

(۲) ئەمە وتەی نووسەرە ..

بریسکەی مانگەشەوەکەم ئەکرد کەوا تاراییکی زیوینی بە شەپۆلی ئاوەکە بەخشیبوو .. وە گوێم گرنبوو بۆ دەنگی مەلەوان و کەشتیەوانەکانی سەر رووبارەکە کە جاروبار گەشتکەرەکانیش بۆیان ئەسەنەدەوە .. چاوەڕوانی دایکەکەیان بووم تا لە نوێژ بێتەوە ..

دایکە هات و بە سەرپۆشێکی سپی قژەسپیەکانی سەری داپۆشیبوو .. لە دەم و چاویا رووناکیی ئیمان و زەردەخەنەی خاوەن ماڵی دڵفراوان دیار بوو ، لە کاتێکا کە یادی خوا بە سەر زمانیەوە بوو ..

دایکە چیرۆکەکەی بە تەواویی بۆ گێڕامەوە منیش لێم پرسی :

« هەستت چۆن بوو کاتێ تاواپارەکە بە تەنیا بە جێی هێشتی و زامەکانت خوێن لێیانەوە سەری ئەکرد لە دامێنی ئەو چەمە قووڵەدا ؟ »

ئەویش کە وەڵامی دامەوە دیار بوو ئیمانی راستەقینە لە وشەکانی پرشنگی ئەوەشاند ، وتی :

«هاوارم ئەکردە خوای گەورە و ئەموت : ئەی خوای دەسەڵاتداری ئاسمانەکان و زەویی ، خۆت چاك شارەزای بە حاڵم .. خوایە ، بە دەسەڵات و تواناکەی خۆت هۆ و ڕێگام بۆ ڕێك خەی بتوانم بەدەلی کوڕەکەم بدەم ، تا بگەڕێتەوە ناو کەس و کاری و بە خێویان بکات .. خوایە هاوار » ..

# لەکۆتاییدا

بـەڵێ .. هاوار تەنها لە خوا ئەکرێت .. هـەر خوا فریای لێقەوماوان و ستەملێکراوان ئەکەوێت ..

هـەر خۆی هانایە ..

هـەر خۆی پەنایە ..

وەڵامی سـتەملێکراو زوو ئەداتـەوە ، ئـەگەر چـی ناموسڵمانیش بێت ..

، خوا ستەمی بـە لاوە ناڕەوایە ..

ناپاکیی کارێکی نامەردانەیە ..

پێغەمبەری خۆشەویستمان ـ صلی اللـه علیـه وسـلم ـ فەرمایشتی زۆری هەن لە بارەی ستەم و ستەم لێکراوانەوە، کـە بـە جوانیی ئەیسەلمێنن تەنهـا لـە سایەی ئیسلاما ستەم قەدەغە و یاساغە .. ئینجا ناپاکیی و خیانـەت کارێکی زۆر سووك و ریـسـوان و ئەوپـەڕی نامـەردیە مـرۆڤ وەفا و

جوامیریی خۆی لـه دەست بدات •

ئینجا بەڵێنی خوای گەورەیە کەوا ستەمکار و ناپاك سەرشۆڕ و ریسوا بکات ••

ئەم چیرۆکە رووداوەش پەند و ئامۆژگاریە بۆ ئـەوانەی خەمخۆری خۆیانن •• بـا چاك بزانن بوونەوەر خوایەکی بەدەسەڵات بە دیی هێناوە و یاسایەکی بێوێنەی بۆ نەخشە کێشاوە •• ئینجا لاریی و نـامـەردیی هیچکات کاری مرۆڤی خاوەن ویژدان نیە و خواش چاوپۆشیی لـێ ناکات ••

بـەڵێ بـا ئیمانداران هەمیشە چاویان لـە دەسـتی پـەروەردگار بێت و سـاتێ تۆڵە و پـاداشتی ئـەویـان لـە یـاد نەچێت•• چونکە خوا هەمیشە ئاگادارە و هیچ کارێکی ـ گەورە یـان بچووك ـ لـە بـەر چاو ون نابێت ••

خوا ئەو خوایـەیە کاروباری بوونەوەر بـە رێـك و پێکیی هەڵئەسوورێنێ ••

ئـەو خوایەیە رزق و رۆزیی هەموو زیندەوەرێـك دیـاریی ئەکات ••

ئـەو خوایەیە چاوی لـە مێروولەیەکی ناو بەردێکی رەقی ناوەڕاستی دەریای پان و پۆڕ هەیە و خۆراك و ژیانی بۆ تەرخان کردووە ، ئیتـر چـۆن چـاوی لـە بێـوەژن و هەتیوەکانی نیە و رۆزییان بۆ نانێرێت ؟

ئەمە پەندە بۆ هەڵگرانی قورئان کەوا هەرگیز خــوا چاو لـە ستەم ناپۆشێت و ستەمکاران ئەکاتە پەندی زەمانە.. خۆ ئەگەر ماوەیەك لـە سەر ستەمیان بـەردەوام بـوون و ماوەیان دا ئەوە دەستبەرداربوون ناگەیەنێ و لە لای خوا گوم نابن ..

هەروەها پەندە کەوا لە نێوان نزای ستەم لێکراو و لــە نێوان خوای گەورەدا پەردە نیە ..

جـا بـا خـەریکی رێـازی شـیرینی خۆیـان بـن و ستەمکارانیش بدەنە دەست خوا !!

---

رقم الايداع في المكتبة الوطنية ببغداد ١٤٤٤
لسنة ١٩٨٤

# ئەم چیرۆکە

- رووداوە و مرۆڤی ژیر ئەتوانێ لە روانگەیەوە دەستی دادپەروەرانەی پەروەردگار ببینێ ..
- دەری ئەخات خوای گەورە دژی ستەمە و مەبەست لە ناردنی پێغەمبەرەکانیشی رەواندنەوەی تەم و دووکەڵی ستەم و رماندنی قەڵای ستەمکارانە ..

نرخی ٢٥٠ فلسە